# عُلُومُ القُرآنِ وفَضائلُها

## زانستی قورئان و پلەو پایە و
## ڕێگاکانی فێربوونی



٢٠١٩ زاینی

١٤٤١ کۆچی


نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

# علوم القرآن وفضائلها

## زانستی قورئان و پلەو پایە و رێگاکانی فێربوونی

**نوسینی**

**لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی**

**ئامادەکردنی**

**خـادم الإســـلام**

**١٤٤١ کۆچی/ ٢٠١٩ زاینی**

# ناوەڕۆک

بسم الله الرحمن الرحيم

## دەستپێک

الحمدلله رب العالمين الحمدلله له ما في السموات وما في الأرض أما بعد...

## فضائل القرآن:

یەکێک لە زانستە هەرە گرنگەکانە لە ئیسلام سەرچاوەی سەرەکی و یەکەمی ئەم دینەیە. هەر لەسەرەتاوە تا ئەمڕۆش گرنگیەکی زۆر بەم عیلمە دراوە و فەضڵ و پلەیەکی زۆر گەورەی هەیە بۆ شوێنکەوتوانی.

هەروەها یەکێکە لە وەسیەتەکانی رسول الله ﷺ لە صحيح مسلم کتێبی (فضائل الصحابة).

کورتەیەک لە وەسیەتەکەی:

أَمَّا بَعْدُ ؛ أَلَا أَيُّهَا النَّاسُ، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ، وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ ؛ أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللَّهِ، فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بِكِتَابِ اللَّهِ، وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ.

واته ئەی خەڵكینە! منیش مرۆڤێكم، ڕۆژێک دێت نێردراوی الله كە (ملک الموت)ە، بێت بۆ لام و منیش وەڵامی بدەمەوە، واتە بمرێت. بۆیە من دوو شتی گرابەهاتان بۆ بەجێدەهێڵم، یەكەمیان كتێبەكەی اللهیە كە قورئانە، كەوا هیدایەت و ڕووناكییە بۆتان دەست گرتووبن پێوەی.

عیلمی قورئان زۆر گرنگی پێدراوە. پێشەوایانی ئوممەت وەک ئیمامی "بخاری" لە (صحیح)ەكەیدا بە ناوی كتێبی (فضائل القرآن) یان صاحب (سنن)ەكان و زانایانی تریش، وەک "إبن كثیر" كتێبی (فضائل القرآن) یان (فضائل القرآن شیخ محمد بن عبدالوهاب) یان (فضائل القرآن للنسائي) گەلێک زۆرن. هەروەها لە (سنن الدارمی)شدا كورتەیەک لە فەرموودەكە درێژە.

عَنْ عَلِيٍّ قَالَ : قِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمَّتَكَ سَتُفْتَتَنُ مِنْ بَعْدِكَ. فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْ سُئِلَ : مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا؟ قَالَ: الْكِتَابُ الْعَزِيزُ الَّذِي لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ.

واتە لە "علی"یەوە الله لێی ڕازی بێت، فەرمووی ئەی رسول الله ﷺ ئوممەتەكەت تووشی فیتنە و تاقیكردنەوە دەبن چی ڕێگایەک هەیە بۆ ڕزگاربوون لێی. فەرمووی:

(الْكِتَابُ الْعَزِيزُ الَّذِي لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ).

واتە قورئانە. بۆیە پێویستە ئێمەش ئەم ڕووناکی و هیدایەت توووند بگرین تا ڕێگای ڕاستیمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە.

**١. پلە و پایەی قورئان (فضل القرآن).**

قورئانی پیرۆز چەندان پلە و پایەی هەیە بۆ ئیماندار لەوانەش، فەرمووودەیەکمان هەیە کە (صحيح)ە لە

سنن الترمزی، مسند أحمد بن حنل، سنن أبی داود:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يُقَالُ - يَعْنِي لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ-: اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَتَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَأُ بِهَا.

واتە "عبدالله بن عمرو" دەڵێت لە النبي ﷺ، فەرمووی: بە خاوەنی قورئان واتە کەسێک قورئانی خوێندبێت و کاری پێکردبێت، بیخوێنەوە و بەرزبەرەوە و بیخوێنەوە وەک چۆن لە دونیادا دەتکرد، چونکە جێگا و شوێنت تا کۆتا ئایەتە. هەروەها قورئان لە دونیادا کەسانێک بەرز دەکاتەوە بەهۆی دەستگرتن و پابەندبوون پێوەی وەک:

عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ أَبِي الطُّفَيْلِ، أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْحَارِثِ لَقِيَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ بِعُسْفَانَ وَكَانَ عُمَرُ اسْتَعْمَلَهُ عَلَى مَكَّةَ فَقَالَ عُمَرُ: مَنِ اسْتَخْلَفْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِي؟ قَالَ: اسْتَخْلَفْتُ عَلَيْهِمُ ابْنَ أَبْزَى. قَالَ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ قَالَ: رَجُلٌ مِنْ مَوَالِينَا. قَالَ عُمَرُ: فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى. قَالَ: إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى، عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ، قَاضٍ. قَالَ عُمَرُ أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ.[١]

واته "عامر بن واثلة أبي الطفيل" دەڵێت "نافع بن عبد الْحارث" گەیشت بە "عمری کوڕی ختاب" الله لێی ڕازی بێت لە (عسفان)بوو، عمر پێی ووت کێت کردووە بەجێنشین دوای خۆت لە ئەهلی (وادی)، ووتی: "ابن ابزی" ئەویش ووتی "ابن ابزی" کێیە؟ ووتی: خزمەتکارێکە لەخزمەتکارەکانمان "عمر" پێی ووت: ئایا خزمەتکارێکت کردووە بەجێنشین؟ فەرمووی ئەو قورئانخوێنە و شارەزایە بە زانستی (فرائض). ئنجا فەرمووی رسول الله ﷺ فەرمووی الله کۆمەڵێک بەم قورئانە بەرزدەکاتەوە و کۆمەڵێکیش نزم.

---

١ صحيح مسلم ومسند احمد وسنن ابى داود

هەروەها قورئان دەبێتە حوججە، واتە بەڵگە بۆ ئیماندار، وەک لە "صحيح مسلم" و "سنن النسائى" و "سنن الترمزى" و "مسند أحمد"دا هاتووە.

عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ، أَوْ تَمْلَأُ مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ. وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ. كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا).

واتە رسول الله ﷺ، دەفەرمووێت: پاک و خاوێنی ئیماندار، ئیمامی "نەوەوی" لە (منهاج) دەڵێت واتای لە نوێژە یان دەست نوێژە، چونکە خاوێنی لە دەست نوێژ مەرجی قبووڵ بوونە. واتە نیوەی ئیمانە و (الحمدلله) تەرازوو پڕ دەکات و (سبحان الله) و (الحمدلله) نێوان زەوی ئاسمان پڕ دەکەن. هەروەها نوێژ (والصلاة نور، فمعناه : أنها تمنع من المعاصي، وتنهى عن الفحشاء والمنكر، وتهدي إلى الصواب) إمام نووی لە (منهاج)دا دەڵێت واتای ڕێگرە لە خەراپە و دووركەوتنەوە لە كاری خراپ و نابەجێ و هەروەها هیدایەتی ڕاستە و خێریش بەڵگەی ڕاستگۆییە و

ئارام گرتن هۆکاری بەردەوامی و ڕۆشنکەرەی ڕێگای هیدایەتە. هەروەها قورئان دەبێتە بەڵگە بۆت و دەبێتە بەڵگە لەسەرت.

## ٢. پلەو پایەی فێرکەری قورئان و ئەوەشی فێردەبێت (فضل تعلم القرآن).

صحيح بخاري:

عَنْ عُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ).

مسند أحمد:

عَنْ عُثْمَانَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ سُفْيَانُ : (أَفْضَلُكُمْ). وَقَالَ شُعْبَةُ: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ).

واتە باشترینتان ئەوانەن کەوا قورئان فێردەبن و خەڵکیش فێردەکەن، لەڕیوایەتێکیشدا دەڵێت (أفضلكم) واتە چاکترینتان.

سبحان الله چی پلەیەکی هەیە. کەواتە باشترین و چاکترین ئیماندار ئەوانەن کەوا خەریکی فێربوون و فێرکردنی (علوم القرآن)ن.

هەروەها "عبدالله بن مسعوود" الله لێی ڕازی بێت دەڵێت:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: تَعَلَّمُوا هَذَا الْقُرْآنَ فَإِنَّكُمْ تُؤْجَرُونَ بِتِلَاوَتِهِ بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرَ حَسَنَاتٍ، أَمَا إِنِّي لَا أَقُولُ بِـ (الم)، وَلَكِنْ بِأَلِفٍ وَلَامٍ وَمِيمٍ، بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرَ حَسَنَاتٍ.

خۆتان فێری قورئان بکەن چونکە ئێوە چاکەتان دەدرێتەوە بەخوێندنەوەی هەر پیتێک دە چاکەیە و نالێم (الم)، بەڵکو (بألف و لام و میم)، بۆ هەریەکێکیان دە چاکەیە، و لە "مسند أحمد" هاتووە:

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ شَافِعٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

خۆتان فێری قورئان بکەن، چونکە تکاکارتان دەبێت لە ڕۆژی دوایی.

هەروەها لە "مسند أحمد" و "سنن ابن ماجە" بە صحیح هاتووە.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ : أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ).

"أنس بن مالك" دەڵێت، رسول الله ﷺ فەرمووی خوای گەورە دوو چین لە خەڵکی هەیە تایبەتە بۆ خۆی، یەکێکان ئەهلی قورئان و ئەویتریان چینی تایبەتی اللەن.

لە حاشیە سەنەدی شەرحی "سنن ابن ماجە" دەڵێت:

(هم أهل القرآن) أي حفظة القرآن يقرأ أناء الليل وأطراف النهار العاملون به قوله (أهل الله) بتقدير أنهم أهل الله أي أولياؤه المختصون به اختصاص أهل الإنسان.

(هم أهل القرآن) واتای قورئان لەبەربکەن و شەو و ڕۆژ دەیخوێنن و کاری پێ دەکەن.

### ٣. پلەو پایەی قورئان لەبەرکەر (فضل حافظ القرآن).

عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَهُوَ حَافِظٌ لَهُ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ، وَمَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ، وَهُوَ يَتَعَاهَدُهُ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ فَلَهُ أَجْرَانِ)[١].

واتە نمونەی ئەوکەسەی کەوا قورئان دەخوێنێت و شارەزا و حافظە لێی لەگەڵ (السفره الكرام)، واتا مەلائیکەی بەڕێزە. نمونەی ئەوەی دەیخوێنێت، بەڵام لەسەری قورسە و زۆر لێی شارەزا نییە دوو پاداشتی هەیە.

لە صحیح "بخاری" و صحیح "مسلم"دا هاتووە:

١ صحیحین "بخاری" و"سلم بن حجاج".

عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لَاحَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ : رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ).

کەوا النبی اللّه ﷺ دەفەرمووێت حەسادەت بردن و ئیرەیی بردن دروست نییە و ناشبێت تەنیا لە دوو شت نەبێت. یەکەمیان یەکێک کە الله قورئانی پێ بەخشیبێت، واتە شارەزا و حافظ بێت کە شەو و ڕۆژ دیراسەی دەکات و دەیخوێنێت، و دووەمیان یەکێک الله ماڵ و سامانی پێ بەخشیبێت و شەو و ڕۆژ لەپێناو الله بیبەخشێت.

سبحان الله قورئانیش پلە و پایەیە الله بە کێی بوێت پێی دەبەخشێت.

**٤. پلەو پایەی خوێندنی قورئان.**

بێگوومان قورئان هەمووی خێرە، یەکێک لەوانە تەنانەت خوێندنەوەشی پاداشتی هەیە. لە "صحیح بخاری"دا هاتووە:

عَنِ الْبَرَاءِرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يَقْرَأُ وَفَرَسٌ لَهُ مَرْبُوطٌ فِي الدَّارِ، فَجَعَلَ يَنْفِرُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ، فَنَظَرَ، فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، وَجَعَلَ يَنْفِرُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ ذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ بِالْقُرْآنِ.

واته کاتێک یەکێک لەهاوەڵانی رسول الله ﷺ قورئانی دەخوێندەوە (فرس) واتە ئەسپێکی بەستبووەوە دەیویست بڕوات، لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت هەڵدەبەزی و دادەبەزی تا خۆی بپچڕێنێت کە سەیری دەرەوەی کرد هیچ شتێکی نەبینی بۆ بەیانی ئەم ڕووداوەی بۆ رسول الله ﷺ باسیکرد، فەرمووی ئەمە مەلائیکەن دادەبەزن بۆ قورئان تا گوێی بۆ بگرن.

هەروەها لـە "سنن الترمزی" هاتووە  لە "إبن مسعوود"ەوە الله لێی ڕازی بێت:

عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لَا أَقُولُ: الم حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ).

واتە  هەرکەسێک یەک پیت لە قورئان بخوێنێت بەچاکە بۆی دەنوسرێت و چاکەکەش یەک بە دەیە، بۆنمونە (الم) سی خێرە.

**٥. دەستگرتن بەقورئان وەصیەتی رسول الله یە.**

یەکێکی تر لەو پلەو پایانەی قورئان بۆ عەبدەکان کە رسول اللّه ﷺ وەسیەی بۆ کردووین تا دەستی پێوەبگرین قورئانە، بۆ؟ چونکە گومڕا نابین و سەر لێشێوا و نابین.

وەک ئەم فەرموودە کە لە "صحیح مسلم"دا هاتووە دوور و درێژە بەڵام مەبەستەکەی خۆمانی لێدەردەهێنم ئەمیش:

أَلَا أَيُّهَا النَّاسُ، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ، وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ؛ أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللَّهِ، فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بِكِتَابِ اللَّهِ، وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ.

واتە ئەی خەڵکینە منیش مرۆڤێکم ڕۆژێک دێت نێردراوی الله بێت واتە (ملك الموت) منیش وەڵامی بدەمەوە، واتە مردن. منیش دوو شتتان بۆ بەجێدەهێڵم دوای خۆم دەستی پێوە بگرن.

یەکەمیان قورئانە کە هیدایەت و ڕووناکیە دەستی پێوە بگرن. دووەمیان (عترت) یان (أهل البيت) کە سونەتە.

هەروەها لە مسند أحمدیش هاتووە:

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (إِنِّي تَارِكٌ فِيكُمُ الثَّقَلَيْنِ، أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الْآخَرِ: كِتَابُ اللَّهِ حَبْلٌ مَمْدُودٌ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ).

واته دوو وەسیەتە گەورەکە یەکێکیان گەورەترە لەوی تریان مەبەست لێی قورئانە و قورئان وەک پەتێک وایە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی بێت، واتە گرتنەبەری ڕێگای قورئان لەزەوییەوە بۆ ئاسمانە ئەگەر نا گومڕا دەبین.

### ٦. پلەو پایەی کۆڕو مەجلیسی قورئان.

لە صحیح و سننەکان فەرموودەمان هەیە بەڕیواتی جیاواز هاتووە هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا دەفەرموویت، لە "أبو هريره" الله لێی ڕازی بێت دەفەرموویت لە رسول الله ﷺ :

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ تَعَالَى، يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ).

واتە هەر کۆمەڵێک کۆببنەوە لە ماڵێک لە ماڵەکانی الله، مەبەست مزگەوتە، ئنجا لەم ڕۆژگارەی ئێستا ماڵەکانیش دەگرێتەوە. تێیدا قورئان بخوێنن و لەنێوانیان یەکدا ئەوا مەلائیکەت دادەبەزێتە سەریان، واتە نێو مەجلیسەکەیان و سۆز و بەزەیی اللەش بۆیان دەڕوات و ملائیکەتیش چوار دەوریان دەدەن. اللەش یادیان دەکاتەوە لای ئەوانەی کەو مەوجودن لای.

ئەم فەرموودەیە لە "سنن ابی داود" هاتووە و (صحیح)ە و لە "مسند احمد"یشدا هاتووە و هەروەها لە "مسلم"یشدا هاتووە، بەڵام بەدرێژی.
بێگومان قورئان پلەو پایەی گەلێک زۆرە و ئەمەش کافییە بۆ کەسانێک بیانەوێت لە پلەو پایەی قورئان تێبگەن.

# علوم القرآن:

## پێشەکی

الحمدلله ولله الحمد والمنه بفضل اللّٰه وتوفيقى، توانيم كەوا چەند زنجيرەيەک لەسەر (علوم القرآن) بنوسم بەشێوەک كە ئەم جۆرە ڕێگایە ڕێگایەكی نوێو تازەیە، چونكە ڕێگاكانی فێربوونی ئەم عیلمەم خاڵ بەخاڵ و بەووردی و بەپووختی بـۆ (طالب العلم)م خستۆتەڕوو، تەنانەت ناوی كتێب و شێوازی فێربوونیش كە ئەمە یەكەم جارە بەمشێوە باس بكرێت كە دەڵێم یەكەم جارە مەبەستم لە ئسلوب و شێوازەكەیە كە ئاسانترین و پووختترین ڕێگایە، چونكە ڕێگای تاقیكراوەیە و هەڵبژێردراوە. لەم چەند بەشە كورتەیەكم لەسەر ئەم عیلمە زۆر گرنگ و گەورەیە باسكردووە و لەگەڵ هەر ڕێگایەک چەندان نمونەم هێناوەتەوە و لەگەڵ هەندێک نموونەی تەفسیر و تەدبر.

قال الله تعالى: ﴿وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾[١]

ئێمە گەیەنەرین ئەم ئەرک و قورساییەی لەسەرمانە لای دەدەین تا نەبێتە بارێكی قورس بۆمان لەقیامەت جا چی كەس نەیخوێنێ و چی

---

١ سورة العنكبوت: ١٨

سەدان کەس ئێمە تەنها دەیگەیەنین هیوادارم  سودی لێببینن و گرنگیشی پێبدەن.

داواکارم لە الله بمکاتە ئامرازێک تەنیا و تەنیا بۆ خزمەتی دین بەکارم بێنێت و دڵم پاک بکاتەوە لە ڕیا و شانازی بەخۆکردنەوە، نیەتم بۆ الله بێت و بمکاتە خزمەتکارێکی تاک بە تاکی ئیمانداران اللهم آمین.

**بەندەی خزمەتکار** **ئەبی عبدالله کوردستانی**

**٣٠ تەمووزی ساڵی ٢٠١٩ز**

## بەشی یەکەم: (حفظ) یان لەبەرکردن.

هەروەک بەڵێنم دابـوو ڕێگاکانی فێـربوونی عیلم بـاس بکەم، پشتیوان بە الله دەست پێدەکەین. یەکەم هەنگاو دەمەوێت پێتان بڵێم بریتییە لە توانای لەبەرکردن یان (تحفیظ)کردن، لەبەرئەوەی دین هەمووی بەڵگەیە بەڵگەکانی بریتین لە قورئان و سوننەت. بۆیە لازمە و پێویستە بەڵگەکان لەبەر بکەین، چونکە تۆ ناکرێت پرسیاری شەرعیت لێبکرێت و نەتوانیت بەڵگەکەی پێ بڵێیت و بۆی بڵێیت.

یەکەم هەنگاو لەبەرکردن قورئانی پیرۆزە، چونکە وەک پێشوو ئاماژەم پێداوە گەورەترین و پڕ ئەجرترن عیلم قورئانە. هەروەها زانایان یان بڵێین هەر لە هاوەڵان و تا سەلەف و زانایانی خەلف یەکەم هەنگاو قۆناغی علمیان بریتی بووە لە قورئان، زۆرینەی زۆری هەر لە سەرەتای تەمەن قورئانیان (حفظ) کردووە. دواتر پێتان دەڵێم بۆچی یەکەم هەنگاو دەبێت ئەمەبێت، چونکە گەر ئەمە نەبێت قۆناغەکانی تر زۆر زەحمەت دەبن و بۆئەمەش الله پێمان دەفەرمووێت.

قال الله تعالى: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾[1]

موفسیران لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێن الله پێمان دەفەرموێت ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان کردووە خوێندنەوە و لەبەرکردنی. کەواتە ئەگەر تۆ بتەوێت زۆر ئاسانە گەرنا زۆر زەحمەتە و بۆ لەبەرکردنیش دەگەڕێتەوە سەر توانای لەبەرکردن تا چی ئاستێکە و چەندە و بۆئەوەی لەبەرکردن ئاسان بێت پێویستت بە یەکلاکردنەوەی نیەتی دڵتە کە ئامانج لێی تەنیا ڕەزامەندی اللەیە. ئنجا هەموو هەوڵ و جوهد و ماندوو بوونێکت بۆ لەبەرکردنی قورئان بێت دڵنیابن ماندووبوونی دەوێت. بۆئەوانەی توانایی لەبەرکردنیان ئاساییە ئەوا لەسەرەتا ڕۆژی یەکەم ئایەتێک دواتر

---

[1] سورة القمر: ٢٢

زیادی بکەن بۆ دوو و سێ تا پێنج تا ماوەیەک، ئینجا ڕۆژی لاپەڕەیەک و ئەم شتەش زۆر ئاسانە ئەگەر بتەوێت. لە داهاتوو بۆتان ڕوون دەبێتەوە بۆچی لەبەرکردن لە هەموویان گرنگترە. هەروەها ئەوانەی توانای لەبەرکردنیان زۆرە بەرنامەی ئەوان جیاوازە چونکە ڕۆژی دەگات بە چوار تا پێنج لاپەڕە.

## بەشی دووەم: خوێندنی تەفسیر یان چی تەفسیرێک؟

قورئان خوێندن و لەبەرکردن بێ تێگەیشتن هەرگیز نابێت و ناکرێت ئایەتێک بخوێن و لەبەری بکەیت و نەزانی چییە و بۆچییە. بۆیە پێویستە بگەڕێنەوە سەر تەفسیری موفسرین، دەزانن بۆ؟ چونکە دین نەقڵە نەک عەقڵ و قورئان لەوانەیە تەنیا یەک وشە یەک پەڕە مانا زیاتر لە خۆبگرێت و ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ژیانی هاوەڵانیش زۆر بەحەزەر و زۆر بەترس بوونە لە باسی قورئان هەرگیز بەعەقڵی خۆیان قورئانیان بۆ خەڵک تەفسیر نەکردووە.

### تەفسیرەکان چین و موفەسیرەکان کێن؟

**یەکەم: تەفسیری قورئان بە قورئان.**

باشترین تەفسیر ئەم تەفسیرەیە، واتە ئایەتێک لە قورئان لە سورەتێکی تر وەڵامەکەی دەداتەوە، ئەمە بە قسەی من نا، بەڵکو زانایان و تەفسیرێکمان هەیە بەناوی (أضواء البيان في إيضاح القرآن) کە "محمد أمين شنقيطي" نوسیوویەتی کە مامۆستای "إبن عسمين" و "إبن باز" و ئەوانەیە هەرچەندە خۆی مردن ڕێگای نەدا هەمووی تەفسیر بکات، بەڵام قوتابیەکەی "إبن عطيه" بەهەمان ڕێچکەی ئەو تەواوی کرد و من خۆم هەموویم نەخۆیندۆتەوە، بەڵام سورەتی (البقره)م خوێندووەتەوە، ئەگەر بێتو دیسانەوە قورئانت لەبەربێت ئاسانترە. بۆنمونە لەتەفسیری ئەم ئایەتە، قال الله تعالى: ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّآلِّينَ﴾[١]

لم يبين هنا من هؤلاء الذين أنعم عليهم. وبين ذلك في موضع آخر بقوله: ﴿فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقاً﴾[٢]

بەمشێوە تەفسیری کردووە و باس و مەسائیلە فیقهیەکانیش زۆر بەووردی و پوختی باسیکردووە و زیاتر و زۆرتر فەرموودەکانی (صحيحين بخاري و مسلم)ی بەکارهێناوە.

---

١ سورة الفاتحة: ٧

٢ سورة النساء: ٦٩

**دووەم: تەفسیری إمام المفسرین "إمام جریر بن طبری" في طبرستان.**

زیاتر مەشهوربووە بە "أبو جعفر" و هەندێک دەڵێن مەبەست تورکمانستانە. ئەم ئیمامە بەڕێزە لە ٢٢٤ کۆچی لەدایکبووە لە ٣١٠ کۆچی وەفاتی کردووە رحمە الله تعالی رحمە واسعە. تەفسیرەکەی زۆرێکی بەسەندی خۆیەتی، چونکە نزیک بووە تەمەنەکەی بەسەند زوو گەیشتووە دووسەد ساڵێک نێوان بووە. پێشتر لەپۆستێک باسم کردووە ئەم تەفسیرە گەرچی دوور و درێژە، بەڵام تەئویلاتی زۆر بەهێزە و تەفسیری زۆرینەی هاوەڵان نقڵ دەکات ئەمە بەکوردی نییە پێم وابێت تەنیا عەرەبییەوە من لە نوسین و تێگەیشتنی ئایەتەکان دەگەڕێمەوە سەری، چونکە تەفسیرێکی جێگای ئیعتبار و موعتەمیدیشە. بەپێی قسەی زانایان و ئەم موفەسیرە خاوەنی دەیان کتێبە لەوانە (تأریخ الطبری).

**سێیەم: تەفسیری إمام الفقه والمفسیر حافظ "عماددین ابو الفداء".**

ناسراوە بە "إبن کثیر"، لەساڵی ٧٠١ کۆچی لەدایکبووە لە ٧٧٤ کۆچی لەتەمەنی حەفتا و چوار ساڵی وەفاتیکردووە. ئەم موفەسیرە بەڕێزە یەکێک بووە لەقوتابییەکانی شێخ الإسلام "إبن تیمیە" و زۆر کاریگەری لەسەر هەبووە. تەفسیرەکەی دوور و درێژە، بەڵام موختەصری لێدەرهێنراوە، واتە کورتکراوەتەوە، چونکە لە ئایەتێک دە قەولی

لێهێنابێت یەک قول و بەڵگەیان لێهێشتووەتەوە. ئەمەش کافییە ئەم تەفسیرە بەکوردیش هەیە، بەڵام فوول کوردی واتە مەتنی فەرموودەکانیش هەموویان کراونە کوردی و ئیمام "إبن کثیر" لەم تەفسیرە ڕای ڕاجعی تەفسیری طەبریشی لە زۆرینەی شوێنەکان هێناوە.

تەفسیرەکانی تر هەن کەوا گرنگن جێگای بایەخن وەک "البغوی" و "سعدی" و "قرطبی" الخ...

لەنێو کورد تەفسیری ڕامان هەیە باشترە، لە تەرجومەکانی قورئان باشترە بۆ تێگەیشتن بۆئەوانەی سەرەتای چوونە نێو علوم قورئانیان بێت، چونکە ئەوەنییە بڵێی تەواو کافی بێت و لەعلوم شەرعی. دەبێت بەردەوام لە فێربوونی زیاتربیت، چونکە سەرچاوەیەک و کتێبێک کافی نیین، بەڵکو لەسەرەتا تەنها چاوکردنەوەن بۆت و من ئەم تەفسیرەم خوێندووە زۆر چاکترە لەتەرجومەکانی قورئان و تەفسیری تریش هەن وەک (التوحید) "عبدالقادر توحیدی" نوسیوویەتی نازانم چۆنە، چۆنکە نەم خوێندۆتەوە، بەڵام باشترین شت بۆتان ڕامانە ئنجا بچنە سەر "إبن کثیر" یان "طبری".

## بەشی سێیەم: زانستی (ناسخ و منسوخ)

پلە بەندی و تەسەلسول لە فێربوونی علومی شەرعی زۆر گرنگە، بۆچی لە یەکەم قۆناغ باسی حەفظی قورئانم بۆ کردن. ئێستا لەم عیلمە زۆر پێویستە، چونکە دەبێت لایەنی لەبەر کردنت زۆر بەهێز بێت و دین نابێت وەک چیرۆک یان وەک ڕۆمان بیخوێنیتەوە، بەڵکو دەبێت لەبەربکرێت.

### عیلمی ناسخ و منسوخ:

ئەم زانستە لەقورئان زۆر پێویستە ئیماندار بیزانێت و گەر بێت و حافظ بیت زۆر ئاسانە. بەڵام ئەم عیلمەش ئیختلافاتێکی زۆری لەسەرە، هەر لە هاوەڵان و تابعین و سەلف هەندێک ئایەت هەیە بە مەنسوخیان داناوە، هەیە دەڵێت نەخێر و هەر یەکە و بەڵگەی خۆی دەهێنێت. بەڵگەکان چونکە زۆرێک پێیانوایە هیچ ئایەتێک نەسخ نەبووەتەوە.

قال الله: ﴿۞مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[١]

١ سورة البقره: ١٠٦

هەروەها ئەم ئایەتە: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ ۙ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مُفْتَرٍ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾[١]

ئەم دوو ئایەتە بەڵگەی تەواوەتین بۆ هەبوونی ئەم عیلمە. ئەم عیلمە لەلایەن هاوەڵان زۆر گرنگی پێدراوە تەنانەت ئیمامی "علی" الله لێی ڕازی بێت فەرموویەتی گەر ناسخ و مەنسوخی نەزانی هیچی لێ وەرمەگرن. قەولێکی صەحیحە لەکتابەکانی ناسخ و مەنسوخ دا هاتووە.

ئێستا ناوی هەندێک کتێب دەخەمە بەردەست طالب العلم:

١- ناسخ و مەنسوخی تابعی بەڕێز "قتادە بن دعامە".

زانایەکی تابعی بووە، هەرچەندە کتێبەکەی کورتە بەتەحقیقەوە ناگاتە ٧٠ لاپەڕە. بۆتێگەیشتنی سەرەتایی باشە.

٢- ناسخ و مەنسوخی "إبن شهاب الزهری".

کە تابعییەکی بەڕێز و فیقییە بووە ئەمەشیان بەتەحقیقەوە ٧٥ لاپەڕە دەبێت و ئەوانەی لە فەرموودە شارەزابن، زۆر ئەم ناوەیان بەرچاو کەوتووە.

---

١ سورة النحل: ١٠١

٣- ناسخ و مەنسوخی "جعفر النحاس".

ئەم کتێبەیان هەڵبژێردراوترین کتێبە لای سەلەف و خەلەف، لەبەرئەوەی هەموو ئیختلافاتەکانیش دەهێنێت باسیان دەکات، بەڵام کەمێک دوور و درێژە بۆ تەحقیق نزیکەی ٣٠٠ لاپەڕە دەبێت و بەتەحقیق دەگاتە ٢٠٠٠ لاپەڕە وردە، بەڵام زۆر چاکە.

٤- ناسخ و مەنسوخی "إبن حزم".

ناسخ و مەنسوخی "إبن جوزی" هەیە کە زۆر چاکە، بەڵام من نەم خوێندۆتەوە تەنیا ئەم چوار کتێبەی سەرەوە نەبێت کە تەواوم کردووە و تابکرێت نحاسەکە بخوێندرێت چاکتر و تەواوترە.

ڕوونکردنەوە ئەم کتێب و ڕێگایانەی من ناوی دەهێنم و دیاری دەکەم قسەی خۆم نییە، بەڵکو منیش بەپێی قسەی زانایان دەیلێم و ڕێگاکانیش تاقیکراوەتەوە و تەنیا ئەوانە دەڵێم کە به عەمەل کردوومە، چونکە دەبێتە (لم تقولون ما لاتفعلون).

هەندێک نمونە لـەسەر ئەم عیلمە لەسەرەتا قیبلەی موسڵمانان ڕووە و "بیت المقدس" بوو بەماوەی شانزە، هەندێک فـەرمووده دەڵێن حەڤدە مانگ و ئەم قال الله: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ﴾[١]

بەڵام ئایەتی ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾[٢]

ئەم ئایەتەی نەسخ کردووە و موسڵمان مولزەم کرا بە گۆڕینی قیبلە بۆ کەعبە. یان لەسەرەتا (شهر الحرام) هەبوو یان (فاعفو وٱصفحوا﴾ بۆ موشریکان هەبوو. بەڵام ئایەتی (سیف) ﴿فَإِذَا انْسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ﴾[٣] ، ئەمانەی نسخ کردووە و ئایەتی ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً﴾[٤]. بەم شێوەیە یان (الخمر والمیسر) بەسێ قۆناغ، ئنجا قەدەغەکرا و ئایەتی قال الله تعالی: ﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ﴾[٥] هەردوو ئایەتی نسخ کردەوە.

شتەکان بەکورتین، بەڵام ڕێگایەکی نوێ و زۆریش بەسوود دەبێت بۆ ئەوانەی هەوڵی فێربوون دەدەن.

---

١ سورة البقرة: ١١٥
٢ سورة البقرة: ١٤٤
٣ سورەتی التوبة: ٥
٤ سورة التوبة: ٣٦
٥ سورة المائدة: ٩٠

## بەشی چوارەم: (أسباب النزول آيات) و (علم التجويد).

فێربوونیش دەبێت بە سیلسیلە بێت، وەک ووتم علومی قورئان دەریایەکە لە عیلم. هەروا ئاسان نییە، واتە ئەم شتە پێتان دەڵێت حوکمدان و بوونە موفتی هەروا بە سادە و سانایی نییە بەڵکو پڕە لە مەرج.

### ١. (أسباب النزول):

بێگومان بۆ تێگەیشتن و زانینی قورئان دەبێت ئەم شتانە بزانرێت کاتێک ئایەتێکت دێتە پێش و دەتەوێت بیکەیت و حوکمی پێ دەرکەیت. واتە پێویستە (طالب العلم) تەفسیری موفسیران لەسەری بزانێت موحکەمات و موتەشابیهات بزانێت و بزانێت ئەسبابی نزولی چی بووە و بۆکێ بووە لە چی حاڵ و کاتێکدا بووە. هۆکاری دابەزینی ئایەت ڕێخۆشکەرە بۆ قوتابی زانستی شەرعی تا ئاسانتر بڕیاربدات و حوکمی لەسەر بدات. بۆنمونە ئەسباب نزولی سورەتی (قل يا أيها الكافرون)، کاتێک موشریکانی قوڕەیش داوای لە پێغەمبەر صلی اللّٰه علیـه وسلم کرد ساڵێک خوای تۆ دەپەرستین و تۆش بەهەمان شێوە. بۆیە الله عز وجل ئایەتی نازڵ کرد بە کافرەکان بڵێ ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم.

چۆن سودی لێوەربگرین؟

بەپێی ئەسباب نزول بێت داوای (تنازل) کراوە بەهیچ شێوەک (تنازل) لە توحید نییە. هەروەها (لا أعبد) دەتوانین بیکەینە برائەت کردن لە کوفر و شیرک، بەڵێ دەبێت ئیماندار مۆقیفی بەرامبەر بە کوفار و مشرکین ڕوونبێت. دەبێت تەبرا لە خۆیان و شیرکەکەیـــان بکرێت. نمونەیەکی تر، ئەسباب نزولی ئایەتی ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾[١]

دوای قۆناغی نهێنی و یەکەم هەنگاوی ئاشکرا، الله تعالى بە رسولەکەی دەڵێت: بڕۆ خزم کەسە نزیکەکانت ئاگاداربکەوە و بیان ترسێنە و هەموویان کۆدەکاتەوە یەک بە یەک داوایان لێدەکات، تەنانەت داوا لە فاتمەی کچی علیه سلام دەکات خۆت بپارێزە لە ئاگر. ئا لەم کاتە "أبا لهب" دەڵێت بەم بەیانییە زووە ئێمەت بۆ ئەم شتە کۆکردەوەتەوە، ئەی دەستت بشکێت!

لەسەر ئەم ووتەیەی "لهبی ملعون" الله عز وجل ئایەتی قال الله تعالى: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾[٢] دابەزاند.

### چۆن سوودی لێوەربگرین؟

---

١ سورة الشعراء: ٢١٤
٢ سورة المسد: ١

دەبێت بانگەواز بۆ ئیسلام و تەوحید لە خزم کەسە نزیکەکان دەست پێبکرێت، هەروەک ئیبراهیم علیه سلام لە باوکی ﴿يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ ۖ ﴾[1]

بەرائەتیش هەر لەوان بێت، چونکە تۆ کە توانیت خۆت تەبرِا بکەیت لە براو کەست لەسەر دین، ئەوا هەمووی دەتوانیت وەک ئیبراهیم (أبو الأنبياء) علیه سلام والصلاة بۆ باوکی ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ ﴾[2]

ئەمە کورتەیەک بوو لەسەر ئەسباب نزول بۆئەوەی قوتابی زانست بزانێت چەندە پڕ ئەهمیەتە لە ڕێگایدا.

٢. **(علم التجويد):**

ئەم عیلمەی قورئان ئێستا لە هەموو شوێن و جێگایەک دەست دەکەوێت بگرە ئوممەت و داعی و مەلاکانیش هەموو خوویان داوەتە ئەم عیلمە وەک بڵێی علمەکانی تر هەر نەبن. بۆیە حاڵی موسڵمانان ئاوایە لەگەڵ قورئان. زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان گرنگە بۆ قوتابی

---

١ سورة مريم: ٤٤

٢ سورة التوبة: ١١٤

زانستی شەرعی، بەڵام عەقیدەی لەسەر دانامەزرێت وەک باقی عیلمە فەرامۆشکراوەکانی تری قورئان.

ئەم زانستە پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات، بەڵام دیسانەوە لایەنی حیفظ سوودی دەبێت. چونکە مەخرج و شوێنی حروفەکانیش هەموویان دیارن دەبێت بزانرێت و عیلمێکی عەمەلییە بە عەملی نەبێت هەرگیز بە نەزەری فێری نابیت حروف مەخرجەکانیش دانراون دیارن. وقل رب زدنی علما.

# تەفسیری سورەتی (الفاتحە)

## چەند نمونەیەک لە تەدەبوور و تەفسیری قورئان لە فەرموودە صەحیحەکاندا:

١- یەکێک لە سورەتە گرنگ و گەورەکانی قورئان ئەم سورەتەیە.

٢- سورەتێکی مەککییە.

٣- چەندان ناوی هەیە (الفاتحە، الحمد، سبع المثانی، أم الکتاب، شافیە، کافیە).

(الفاتحە): چونکە سەرەتای دەستپێکی قورئانە (الحمد): چونکە دەستپێکردنی بە (الحمدلله)یە.

(أم الکتاب): چونکە هەموو مەبەستەکانی دین لەخۆ دەگرێت.

(سبع المثانی): ﴿وَلَقَد آتینك سَبعاً منَ المثانی والقرآن العظیم﴾[1]

(شافیە): چونکە فەرموودەی (صحیح)مان هەیە کەوا ڕووقیەیە.

هەر لە دەستپێک بە (الحمدلله) دەست پێدەکات. سوپاس و ستایش بۆ الله چونکە (له الحمد في الأولى والآخرة). (الحمدلله) باشترین دووعایە

---

١ سورة الحجر: ٨٧

وەک لە فەرموودە واردە (أفضل الذكر لا اله الا اللّٰه وأفضل الدعاء الحمد للّٰه) یان (سبحان الله وبحمده).

کەواتە سوپاسی کێ دەکەیت، (الحمد) بۆ کێیە؟

بۆ (الله)یە. بەڵێ دانپێدانانە بە (توحيد لله) الله. هەروەها (رب العالمين)، ئنجا زیاتر داندەنێین بەگەورەیی الله. (رب) ئاماژەیە بۆ (توحيد ربوبيه) (رب العالمين).

دواتر (الرحمن الرحيم): دانپێدانانی (توحيد أسماء والصفات). (الرحمن) لە دونیا بۆ هەموو کەون و گەردوون. (الرحيم) لە قیامەت تەنیا بۆ ئیمانداران. كما يقول الله تعالى: ﴿وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾[١].

ئەوەیە تێفکرین یان تەدەبوری قورئان، تەنیا لە چەند ئایەتێک تەوحیدێکی خالص هەیە.

ئنجا (ملك يوم الدين): داننان بە ئاخیرەت و ئیمان هێنانە بە (يوم القيامه)، کەواتە یەکێکیشە لە ئەرکانەکانی ئیمان هێنان.

ئنجا ئیسپات کردن دێتە پێش بە پەرستن (إياك نعبد): شاهێدی لەسەر خۆمان دەدەین کەوا مۆحید یەکخواپەرست بین تەنها الله دەپەرستین.

---

١ الأحزاب: ٤٣

(وإياك نستعين): دواى پەرستن تووەکل ئیسپات دەکەین، وەک الله پێمان دەفەرمووێت: (وتوكل على الله).

ئنجا دووعا بۆخۆمان دەکەین بۆ پیشاندانی ڕێگای ڕاست و دروست بۆ چوونە سەر مەنهەجی حەقیقی. (اهدنا صراط المستقيم): ڕێگای ڕاستیش ئیسلامە.

ئنجا داوا لە الله دەکەین گومڕاو سەلێشێواومان نەکات. وەک (غير المغضوب عليهم): واتە ئەوانەی غەزەبی اللەیان بەسەرداهاتووە کە ئەمانیش یەهودن واتە جولەکەن.

(ولا الضالين): ئەمانیش گاور یان نەصرانییەکانن.

بۆیە الله پێمان دەفەرمووێت: ﴿لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ﴾[1]

ئەمە بەکورتی کەمێک تەدەبوور بوو. بەڵام ئایا لە تەرجەمەکانی قورئان لە ئێستا ئەمانەت پێدەڵێت، تا ئێستا زۆرینەی بەناو مەلاکانی کۆن و زۆرێک لە خەڵک کە دەڵێن فلان مرد ڕاست دەڵێن (الفاتحه)! لە تازیەی داهێنراویش هەر دەڵێن (الفاتحه)! تەنانەت لەکاتی زیارەتی مردوو هەر دەڵێن (الفاتحه)! لەهەموو سەیرتر تەنانەت لەسەر کێڵی قەبرەکەش هەر نوسراوە (الفاتحه)! ئاخر بۆیە حاڵ گەیشتووە بەمە گەر ئەم خەڵکە لە

١ سورة المائدة: ٥١

واتای قورئان بزانێت یان ئەم سورەتە بزانێت، دەزانێت کەوا ئەم سورەتە فەردیە و تایبەت بە خودی خۆتەوە و بۆ خۆتە و لەپێناو خۆتە و دووعا و پاڕانەوەش هەر بۆخۆتە تا گومڕا نەبیت.

**ڕوونکردنەوە:** ئەمە دینە واتە نەقڵ، نەک عەقڵ. ئەوانەش کە من نوسیوومە هەمووی هەر نەقڵە، تەنیا عەقڵ بۆ گەیاندنی ئەم نەقڵە، بەڵام دەبێت نەقڵ بەحیکمەت بێت.

## بۆ (طالب العلم) فێربوونی زانست فەرزە

علومی قورئان وەک دارێکە قەدە گەورەکەی کیتاب بێت، ئنجا لق و گەڵای لێبێتەوە، واتە لەئایەت باسی نوێژ دەکات، ئنجا لە فەرموودەدا زیاتر ڕوونی دەکاتەوە بەچەندەها فەرموودە و دواتر زانایان شەرحی دەکەن.

بۆ ناسینەوەی سورەتەکان، ئایا مەککییە یان مەدەنییە. ئەو سورەتانەی باسی (وجاهدوا في سبيل الله) (وهاجروا) (وقاتلوا)، واتە ئەم ئایەتانەی باسی قیتالی موشریکین دەکەن، ئەوانە مەدەنین. چونکە دوای هیجرەت، ئنجا قیتال دەستی پێکرد. لە سورەتە مەککییەکان زیاتر باسی تەوحید و یەکخواپەرستی و دوورکەوتنەوە لە شیرک دەکەن. ئەوە وەک قاعیدە،

بەڵام لەهەموو عامێک ئیستثناء هەن. هەندێک لەو سورەتە قیتالیانە کە زۆر گرنگن موحکەماتن، وەک سورەتی (الأنفال) و (التوبە)، هەروەها (النساء) کە لە کۆتاییەکەی باسی فەضڵی هیجرەت و جیهاد دەکاتن.

ئەمجارە نمویەیەک لەسەر نەسخ، بۆنمونە لە سورەتی (الأنفال) لەباسی ڕووبەڕوبوونەوەی کافران الله بە ئیمانداران دەفەرمووێت: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾[1]

لەم ئایەتە الله یەک ئیمانداری بەرامبەر دە کافر داناوە بۆ شەڕکردن، بەڵام دواتر هەر لەئایەتی دوای ئەو: ﴿الْآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[2]

لەم ئایەتە کردیە یەک بەرامبەر دوو، واتە یەک ئیماندار لە جیهاد بەرامبەر دوو کافرە، واتە ئایەتی سەرەوە بەم ئایەتە نەسخ بووەوە و ئەمەیان حوکمی لەسەر دەدرێت.

---

١ سورة الأنفال: ٦٥

٢ سورة الأنفال: ٦٦

نمونەیەک لەسەر موتشابهات:

﴿وَيكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾[١]

﴿ وَيكُونَ دين كُلُّهُ لِلَّهِ﴾[٢]

## چی عیلمێک دەستدەکەوێت لە قورئان؟

پێشوتر کورتەیەکم لەسەر (أفضل العلم قرآن الكريم) پۆست کرد. بەڵام دەبێت شتێک بزانن، ئەویش ئەمەیە ئێستا ئەم عیلمە بەئاسانی دەست ناکەوێت چونکە لەهەموو شوێن باسی لێوە ناکرێت. لەم کاتەدا لەم زانستە پڕ ئەجرە تەنیا ئەمانەت پێ دەڵێن:

**یەکەم: (تحفیظ القرآن)**

لەبەرکردنی قورئان، واتە دەورە و خولێکی زۆر لەسەر لەبەرکردن دەکرێتەوە.

**دووەم: (تجوید القرآن الكريم)**

---

١ سورة البقره: ١٩٣

٢ سورة الأنفال: ٣٩

زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان و ئەم علومەش واتە تەجوید. ئێستا زۆر ئاسانە فێربوونی چونکە چەندان سەنتەر و کەناڵ ئەم زانستە دەخوێنرێت.

**سێیەم: (قرائات القرآن الكريم)**

ئنجا ئەمەشیان زۆرە لە مزگەتەکان لەکەناڵەکان و لەسەنتەرەکان. ئێستا دەور دەوری قورئانخوێنەکان باش ناوبانگیان دەرکردووە!

## چی بەدەست ناکەوێت لە (علوم القرآن الكريم)؟

**یەکەم: (تدبر في قرآن الكريم)**

گەربێت و کەناڵەکان و سەنتەرەکان هێندەی کەمێک گرنگی بە (تدبر) و (تفکر) و (تذکری) قورئان بدەن، ئەم کات جێلێکی عالم و موتەقی و یەکخواپەرست بەرهەم دێت، بەڵام نەخێر. "بلال بن رباح" الله لێی ڕازیبێت دەڵێت چووم تا بانگ بدەم بانگی بەیانی بینیم رسول الله ﷺ دەگریا. ووتم بۆچی دەگریەیت ئەی پێغەمبەری خوا، لەکاتێکدا الله لە گوناهی پێش و پاشت خۆشبووە. فەرمووی: هاوار بەحاڵت چۆن نەگریم! ئەم شەو ئایەتم بۆ دابەزی کە بریتی بوو لە سورەتی (آل عمران)

خوێندیەوە و فەرمووی هاوار بەحاڵی ئەو کەسەی ئەمە بخوێنێتەوە و لێی تێنەگات و بیری لێنەکاتەوە.[١]

تەدەبور زۆر گرنگە بەهۆی تەدەبورەوە دەچیتە ناو ناخی وشەکان و وشەکانیش دەچنە ناو دڵت و زیندووی دەکاتەوە ئەمەش زۆری دەوێت، بۆیە با بەکورتی بێت.

### دووەم: (تفسير القرآن الكريم)

ئەمڕۆ لە مزگەوتەکان لە سەنتەرەکان تەفسیری قورئان بە خەڵک ناڵێن فێریان ناکەن. بەڵکو فێری تەرجومەی قورئانیان دەکەن، واتە بەس وەری دەگێڕنەوە، بۆیە کەس لێی تێناگات. لەتەفسیرەوە فێر دەبێت ئایەتەکان چی مانایەکیان هەیە و بۆچی و بۆکێ و لەچی کاتێک بەکاردێت. ئەمە زۆر گرنگە سەیری تەفسیری موفەسیرین بکەن یەک وشە لەقورئان بە عەقڵی خۆیان لێک نادەنەوە. بەڵکو هەمووی یان زۆرینەی نەقڵە، بەڵێ دەبێت بەنەقڵ بێت، چونکە ئەمە دینە نەقڵە نەک عەقڵ. ئەمڕۆ خەڵک شوێن عەقڵ کەوتووە وازی لە نەقڵ هێناوە، بۆیە عیلم نەماوە خەڵک بۆتە ئارەزوو پەرست. لە تەفسیری "ابن كسير" و "ابن جرير" و هاوشێوەکانیان دەیان لاپەڕە تەنیا لەسەر سورەتی

---

١ صحيح ابن حبان

(الفاتحە)یە، کەچی لەتەرجومەی قورئان لە ئێستا هەمووی ناکاتە پەڕەیەک!

## سێیەم: (الناسخ والمنسوخ)

ئەم زانستەش لە قورئـان فەرامۆش کراوە بایەخی پێنادرێت، لەکاتێکدا یەکێکە لە بەشە ئەساسییەکانی ئەم عیلمە کە دەبێـت (طالب العلم) بەهەرجۆرێک بێت خۆی فێربکات. بەڵام ئەمەشیان دەستکەوتنی لە هەموو شوێنێک ئاسان نەماوە. بۆنمونە نموونەیەک لەم زانستە لەبارەی حەڕامکردنی (الخمر) یان ئارەق بەچەند قۆناغێکە وەک لە سورەتی (البقرە) دەفەرموویت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾[1]

دواتر دوای ماوەیەک ئایەت دابەزی ﴿لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾[2]

---

١ سورة البقرة: ٢١٩

٢ سورة النساء: ٤٣

تائێستا حەرام نەکراوە، ئنجا ئایەت دابەزی قال الله تعالى: ﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ﴾[١] هەمووی نەسخ کردەوە.

کەواتە عیلمە ئەساسییەکان بەئاسان دەست ناکەوێت. ئەم جۆرە باسانە گرنگن بۆتان، بۆیە گرنگی پێبدەن.

## سورەتی ڕیسواکردن

دەتەوێت بزانیت "سەعیدی کوڕی جوبەیر" ووتی بە "ابن عباسم" ووت ڕەزاو ڕەحمەتی اللەی لێبێت لەبارەی سورەتی (التوبە)، ئەویش فەرمووی بەڵکو ڕیسواکردن بوو یان دەرخستنی ڕووی موونافیقەکان بوو. بەجۆرێک دادەبەزی و وا گومانمان برد ئیدی یەک لە ئێمە نامێنێت ئیلا باسی دەکرێت و ڕووی پیشان دەدرێت.

### هەندێک زانیاری وەک بیرخستنەوە لەسەر ئەم سورەتە:

١- سورەتی (التوبە)، هەروەها پێی دەڵێن (البرءة) لەبەرئەوەی سەرەتای ئەم سورەتە تەبەڕاکردنە لە موشرکین.

---

١ سورة المائدة: ٩٠

٢- ئەم سورەتە مەدەنییە و یەکێکە لە سورەتە هەر گرنگەکان کە زۆر گرنگە ئیماندار بەجوانی بیخوێنێت.

٣- زۆرترین ئایاتی موحکەماتی تێدایە و زۆرترین ئایاتی مەنسوخ کراو بەئایەتەکانی ئەم سورەتە نەسخ کراون.

٤- یەکێکە لە سورەتە قیتالی و جیهادییەکان کاتێک دەیخوێنیتەوە حەماسەت دەتگرێت و زۆریش گرنگە لەم کاتەدا خوێندنەوەی ئەم سورەتە بەتەفسیرەوە.

٥- زۆرترین مونافیق لەم سورەتە ڕیسواکران، بۆیە لێرەش "إبن عباس" دەڵێت وامانزانی هەموومانی تێدایە.

تاکە سورەتە لەسەرەتای خوێندنەوەی (بسم الله)ی لێ ناکرێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ تەنها پەناگرتن لەشەیتانی لێ دەکرێت.

٦- یەکێک لەئایەتەکانی پێی دەڵێن (آيات السيف)، کەوا زۆرترین ئایەتی پێ نەسخ کراوە.

﴿فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[1]

---

١ سورة التوبة: ٥

حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُطِيعٍ حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ عَنْ أَبِي بِشْرٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لابْنِ عَبَّاسٍ سُورَةُ التَّوْبَةِ قَالَ آلتَّوْبَةِ قَالَ بَلْ هِيَ الْفَاضِحَةُ مَا زَالَتْ تَنْزِلُ وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ. حَتَّى ظَنُّوا أَنْ لاَ يَبْقَى مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ ذُكِرَ فِيهَا.[١]

داواكارم لێتان بیخوێنەوە بە تەفسیرەوە، چونکە بەم نزیکانە کارمان پێی دەبێت. براءة من اللّٰه ورسوله.

## ئەو سوورەتانەی پیریان کرد

رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: (شَيبتني هُود وأخواتها).

لەڕیوایەتێکی تردا: (شيبتني هود والواقعه والمرسلات عَم يتساءلون إذا الشمس كورت).

دەفەرمووێت پیریان کردم "هود" و هاوشێوەکانی کە لەفەرموودەکەی تر باسی کردووە. موفەسیران دەڵێن لەناو سورەتی (هود) ئایەتی: ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ﴾[٢].

ئەم ئایەتەیە "إبن عباس" الله لێی ڕازیبێت دەفەرمووێت هیچ ئایەتێک هێندە قورس و زەحمەت نەبووە وەک ئەم ئایەتە. وەک بیرهێنانەوە رسول

---

١ صحيح مسلم: ٧٤٣

٢ سورة هود: ١١٢

الله ﷺ كەسێکی پیر نەبوو واتە ڕەنگ و ڕیش و پرچی. "أنس ابن مالك" الله لێی ڕازی بێت دەڵێت چەند دانە موویەکی سپی پێوەبوو.

ئەوە زانیمان هۆکاری پیربوونی رسول الله و هاوەڵان بریتی بووە لە قورئان و دین خەمی قیامەتیان. ئەی ئێمە چی شتێک بە خۆمان بڵێین، کەوا دەڵێین (شیبتنی الدنیا ومتاعها وزینتها)، خۆشی و ڕازاوەیی دونیا پیری کردین.

قال الله تعالی: ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾[1]

أفلا تتفكرون

## قورئان بکە مامۆستات

کاتێک کە قورئان دەخوێنێت لە زۆر ئایەت بەتایبەت قیصەصەکان، لەکۆتایی زۆرینەی ئایەتەکان الله پێمان دەفەرمووێت (أفلا تتفكرون) یان (أفلا تعقلون) یان (لقوم يتذكرون) یان (يتفكرون) یان (يؤمنون). لەم ئایاتانەدا الله داوامان لێدەکات تەدەبوری تێدا بکەین و تێبگەین و بزانین ئامانج چییە و بۆچییە و بۆکێیە.

١ سورة الزمر: ٢٩

قال الله تعالى: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾[١]

سبحان دڵی قوفڵ و خەتمی لێدراوە و هەرگیز لەئایەتەکان ناگات و ئەگەر بشی خوێنێت هیچی لێ فێرنابێت. دەبینیت زۆرێک لە خەڵک ئەم ئایەتە دەخوێنن. قال الله تعالى: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ﴾[٢]

تەنها ئیسلام قبووڵکرا و هەڵبژێردراوە لەسەر زەوی کە حوکمی اللەی تێدایە تا بچەسپێت، کەچی لەم لاوە لەگەڵ عیلمانییە یان مارکسییە یان دینەوییە. کەواتە تێنەگەیشتووە چونکە دڵی قوفڵە گەر نا دەیزانێت الله لەقورئان دەفەرمووێت.

قال الله: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[٣]

بەڵام دەبینین الله وەڵامی ئەوانەمان پێ دەڵێت:

قال الله تعالى: ﴿خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰ أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ ۖ ﴾[٤]

---

١ سورة محمد: ٢٤
٢ سورة آل عمران: ١٩
٣ سورة آل عمران: ٨٥
٤ سورة البقرة: ٧

بۆچی مۆریان لێدراوە چونکە دینی حەقیان قبووڵ نەبوو.

ئەمە کەمێک لە وردبوونەوەیە لەئایەتەکان و تەفسیر یان پرسیار بە ئایەتێک وەڵام بە ئایەتێکی تر.

ئایا قورئان چاکترین مامۆستا نییە؟

**خادم الإسلام**

**لێکۆڵەر أبی عبدالله کوردستانی**